# پێڕست

# جێگیرکردنی تەرازوو لەڕۆژی دوایی

باوەڕهێنان بە تەرازوو -المیزان- یەکێکە لەبنچینەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت وە لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و لە ئاثاری هاوەڵاندا باسکراوە و موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر جێگیرکردنی

الله تعالی لەقورئاندا ئەفەرمووێت:

﴿وَالوَزنُ يَومَئِذٍ الحَقُّ فَمَن ثَقُلَت مَوٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ المُفلِحُونَ | وَمَن خَفَّت مَوٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِأَيٰتِنَا يَظلِمُونَ﴾

(الأعرَاف :٨-٩)

واتا: کێشانی کردەوەکانی مرۆڤەکان لەدوارۆژدا حەق و ڕاستە، وە هەرکەسێک تەرازووی چاکەکانی قورستربێت بەسەر تەرازووی خراپەکانییەوە ئا ئەوە ئەوکەسانەن کە سەرفرازن، وەهەرکەسێک تەرازووی خراپەکانی قورستربێت و چاکەکانی سوکتربێت ئا ئەوانە ئەو کەسانەن کە نەفسی خۆیان دۆڕاندووە بەهۆی ئەوەی کە ئیمانیان نەهێنا بە ئایەتەکانی الله تعالی و ئایەتەکانی الله تعالی یان بە درۆ ئەزانی و نکۆڵییان لێ ئەکرد

وە الله سبحانە وتعالی ئەفەرمووێت:

﴿وَنَضَعُ المَوٰزِينَ القِسطَ لِيَومِ القِيٰمَةِ فَلَا تُظلَمُ نَفس شَيئا وَإِن كَانَ مِثقَالَ حَبَّة مِّن خَردَلٍ أَتَينَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾ (الانبياء : ٤٧)

واتا: تەرازووی دادپەروەری دائەنێین لەڕۆژی دوایی بۆ بەرپاکردنی

دادپەروەری ، هیچ بەندەیەک بچوکترین ستەمی لێناکرێت ئەکەر دەنکێکیش بێت لە خەردەل ئەوا ئێمە ئەیهێنین (کاروو کردەوەکانی ئەهێنین و وازلەهیچ کام لەکردەوەکانی ناهێنین) وە بەسە کە ئێمە ژمێریار بین بۆ کردەوەکانی و لێپێچینەوەی لەگەڵ بکەین.

وە الله سبحانە وتعالى ئەفەرمووێت:

﴿فَمَن ثَقُلَت مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلمُفلِحُونَ | وَمَن خَفَّت مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ﴾(المؤمنون : ١٠٢-١٠٣)

واتا: ئەو کەسانەی کە کردەوە چاکەکانیان قورستربێت لەتەرازوودا لەڕۆژی دوایی دا ئا ئەوانە سەرفرازن، بەڵام ئەو کەسانەی کە تەرازووی کردەوە خراپەکانیان قورستربێت وە چاکەکانیان سوکتربێت ئا ئەوە ئەو کەسانەن کە نەفسی خۆیان دۆڕاندووە و هەتا هەتایە لەدۆزەخا ئەبن

## ئایا کار و کردەوەی کافران لەڕۆژی دوایی دا بەتەرازوو ئەکێشرێت ؟

- کار و کردەوەی کافران لەتەرازوودا ئەگەر مەبەست ئەوەبێت کار و کردەوەیان بکێشرێت بە چاکە و بە خراپە بۆ ئەوەی چاوەڕێی پاداشت بن ئەمەیان ڕوونادات، چونکە کافران و بێباوەڕان کار و کردەوەیان بەتاڵ و پووچە

وە الله سبحانە وتعالی لەم بارەیەوە ئەفەرمووێت:

﴿وَلَقَد أُوحِيَ إِلَيكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبلِكَ لَئِن أَشرَكتَ لَيَحبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الخَٰسِرِينَ ﴾ (الزُّمَر : ٦٥)

واتا: ئەی موحەممەد ﷺ وەحیمان ناردووە بۆتۆ و بۆ ئەوانەی پێش تۆش لەپێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- ، ئەگەر هاوبەشی بۆ الله تعالی بڕیار بدەیت و شیرک بکەیت کار و کردەوەکانت پووچ و بەتاڵ ئەبێت وە لە خەسارەتمەندان ئەبیت.

جا بۆیە بەو مانایەی کە کافران و بێ باوەڕان کار و کردەوەیان بکێشرێت بە چاکە و بە خراپە بۆ ئەوەی چاوەڕێی پاداشت بن شتی لەم جۆرە ڕوونادات، چونکە کارو کردەوەی کافران بەهۆی ئیمان نەهێنان بە الله تعالی وە بەهۆی شەریک بڕیاردان هیچ کار و کردەوەیەکی باشی نییە هەمووی پووچە.

الله سبحانە وتعالی ئەفەرمووێت:

﴿وَقَدِمنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِن عَمَل فَجَعَلنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴾ (الفُرْقان : ٢٣)

واتا: ئێمە کار و کردەوەی کافرانمان والێکرد وەک تۆزێک و بایەک پەرش و بڵاومانکردەوە هیچ سودێکی نییە بۆی و بەکەڵکی نایەت.

کەواتە کافران هیچ کار و کردەوەیەکی چاکیان نییە تاوەکو بکێشرێت

بۆیە ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه ئەفەرمووێت:

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ :«إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ الْمُؤْمِنَ حَسَنَةً يُعْطَى عَلَيْهَا فِي الدُّنْيَا،

وَيُثَابُ عَلَيْهَا فِي الْآخِرَةِ. وَأَمَّا الْكَافِرُ فَيُطْعَمُ حَسَنَاتِهِ فِي الدُّنْيَا حَتَّى إِذَا أَفْضَى إِلَى الْآخِرَةِ، لَمْ يَكُنْ لَهُ بِهَا حَسَنَةٌ يُعْطَى بِهَا خَيْرًا»[(١)].

واتا: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی الله سبحانه وتعالى ستەم لەهیچ ئیمانداڕێک ناکات کە چاکەیەکی کردبێت کە پاداشتی دابێتەوە لەدونیا دا وە لەدوارۆژیشدا پاداشتی ئەداتەوە، بەڵام کەسی کافر ئەگەر چاکەیەک بکات بۆ الله سبحانه وتعالى (یارمەتی هەژارێک بدا یان پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنێت یاخود لەگەڵ دراوسێیدا باشبێت یان غەیری ئەوە لە کاروو کردەوە چاکەکان ئەگەر بۆ الله تعالى بیکات) ئەوا الله تعالى هەر لەدونیا دا پاداشتەکەی ئەداتەو ( بەوەی کە ڕزق ئەدات و بەوەی کە سەلامەتی ئەکات و بەوەی کە منالی پێ ئەبەخشێت و وە هاوشێوەی ئەمانە) هەتاوەکو ئەم کافرە ئەگاتەوە بەدوارۆژ، ئەم کافرە هیچ چاکەیەکی نییە کە الله تعالى پاداشتی بداتەوە ( بەڵکو هەر شیرک و کوفر و تاوانەکانی هەیە ) .

بۆیە دایکمان عائشة رضي الله عنها ئەڵێت:

قُلْتُ :«يَا رَسُولَ اللَّهِ، ابْنُ جُدْعَانَ كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ يَصِلُ الرَّحِمَ، وَيُطْعِمُ الْمِسْكِينَ، فَهَلْ ذَاكَ نَافِعُهُ ؟ قَالَ : " لَا يَنْفَعُهُ، إِنَّهُ لَمْ يَقُلْ يَوْمًا : رَبِّ، اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ»[(٢)].

---

(١)مسند الإمام أحمد

(٢) صحيح مسلم

واتا: وتم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ، ابن جدعان لە جاهیلی دا پەیوەندی خزمایەتی بەجێ ئەگەیاند و خواردنی هەژارانی ئەدا، ئایا ئەوە هیچ سودێکی پێ ئەکەیەنێت لە دواڕۆژدا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوودی نییە بۆی، لەبەر ئەوەی ڕۆژێک لەڕۆژان نەی وتوە ئەی پەروەردگار لەدواڕۆژدا لەتاوانەکانم خۆشبیت

مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە ئیماندار و موسڵمان نەبووە، کەواتە هەرکەسێک ئیماندار نەبێت و کافر و بێباوەڕ بێت ئەوە کردەوەکانی ناکێشرێت بەو مانایەی کە چاکە و خراپەی بکێشرێت و چاوەڕێی پاداشت بێت

بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ڕواڵەتی بەڵگەکانی قورئان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کردەوەکانی کافر لەکوفر و شیرک و تاوانەکان ئەکێشرێت بەو مانایەی کە الله تعالی بیانوو بڕی بکات و سەرشۆڕ و ڕسوای بکات بەوەی کە کار و کردەوەکانی هیچ سەنگ و قورساییەکیان نییە لەلای الله تعالی

وە الله سبحانه وتعالی ئەفەرمووێت:

﴿أُولَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا﴾ (الكهف : ١٠٥)

واتا: ئا ئەوانە کە بێباوەڕبوون بە ئایەتەکانی الله تعالی و بەڕۆژی گەیشتنەوە بە الله تعالی، کار و کردەوەکانیان پووچ و بەتاڵ بۆتەوە و لەڕۆژی دوایی دا کار و کردەوەکانیان هیچ سەنگ و قورساییەکیان نییە.

بەهەمان شێوە کە ئایەتەکە ئەفەرمووێت:

﴿وَمَن خَفَّت مَوٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴾
(المُؤمنون : ١٠٣)

واتا: ئەوەی کە تەرازووەکەی سوکبێت ئا ئەوە ئەو کەسانەن کە نەفسی خۆیان دۆڕاندووە و هەتا هەتایە لەدۆزەخدا ئەبن ( واتا کافران ) .

أبو هريرة رضي الله عنه ئەڵێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

«إنه ليأتي الرجل العظيم السمين يوم القيامة، لا يزن عند الله جناح بعوضة. وقال: اقرؤوا إن شئتم: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُم يَومَ القِيٰمَةِ وَزنًا ﴾ (الكهف : ١٠٥) [١].

واتا: لەرۆژی دوایی دا پیاوێک ئەهێنن کە پیاوێکی گەورە و قەڵەوە بەڵام لای الله تعالی بە ئەندازەی باڵە مێشولەیەک سەنگ و قورسایی نییە، پاشان فەرمووی ئەم ئایەتە بخوێننەوە ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُم يَومَ القِيٰمَةِ وَزنًا ﴾
(الكهف : ١٠٥)

واتا: لەرۆژی دوایی دا ئەو کافر و بێباوەڕانە هیچ سەنگ و قورساییەکیان بۆ دانانرێت.

---

(١)صحيح البخاري - كتاب التفسير

وە هاوەڵی بەڕێز **كعب بن عجرة** ئەڵێت:

«یؤتى بالرجل یوم القیامة، فیوزن بالحبة، فلا یزنها ویوزن بجناح بعوضة فلا یزنها»، ثم قرأ: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُم يَومَ القِيٰمَةِ وَزنًا ﴾ (الكهف : ١٠٥) [٢].

واتا: لەڕۆژی دوایی دا پیاوێک دێنن ئەیكێشن بەدەنكە جۆیەک بەدەنكە گەنمێک ئەم كەسە كێش و سەنگایی ئەم دەنگە جۆیە ئەم دەنكە گەنمەی نییە، وە ئەیكێشن بەباڵی مێشولەیەک ئەم كەسە سەنگایی ئەم باڵە مێشولەیەی نییە. وە ئەم ئایەتەی خوێند ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُم يَومَ القِيٰمَةِ وَزنًا ﴾ (الكهف : ١٠٥)

واتا: ئا ئەوانە لەڕۆژی دوایی دا هیچ سەنگ و قورساییەكیان نییە.

عمری كوڕی دینار ئەفەرمووێت كە گوێم لە **عبیدی كوڕی عمیر** بوو ( كە یەكێكە لە تابعین ) فەرمووی:

«يُؤتَى بِالرَّجُلِ العَظِيمِ الطَّوِيلِ يَوْمَ القِيَامَةِ فَيُوضَعُ فِي المِيزَانِ، فَلَا يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ ، وَقَرَأَ ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُم يَومَ القِيٰمَةِ وَزنًا ﴾ (الكهف : ١٠٥) [٢].

واتا: لەڕۆژی دوایی دا پیاوێک دێنن كە پیاوێک گەورە و باڵادرێژە، ئەم پیاوە ئەكرێە ناو تەرازووەوە ، ئەم كەسە لای اللّٰه تعالى سەنگ و قورسای باڵە مێشولەیەكی نییە،

---

(١) كتاب الزهد لوكیع ، (٢) مصنف ابن أبي شیبة

. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُم يَومَ القِيٰمَةِ وَزنًا ﴾ (الكهف : ١٠٥)

واتا: ئا ئەوانە لەڕۆژی دوایی دا هیچ سەنگ و قورساییەکیان نییە.

جێگیرکردنی تەرازوو بەڵگەی زۆری لەبارەوە لە قورئان باسکراوە وەک لەپێشوو ئاماژەمان پێدان و لە فەرموودەکانیشدا باسکراوە

أبو هريرة رضي الله عنه ئەڵێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

«وَبِيَدِهِ الْمِيزَانُ يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ»[١].

واتا: تەرازوو بە دەستی الله تعالی یە و کێ بوێت دایئەگرێت و کێ بوێت بەرزی ئەکاتەوە.

نەواسی کوڕی سمعان رضي الله عنه ئەفەرمووێت کە بیستۆتی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

«والميزانُ بيَدِ الرَّحمنِ عَزَّ وجَلَّ يَرفَعُه ويَخفِضُه» [٢].

واتا: تەرازوو بە دەستی الله تعالی یە بەرزی ئەکاتەوە و وە نزمی ئەکاتەوە.

---

(١)صحيح البخاري -كتاب التفسير-

(٢)سنن الترمذي ، واخرجة ابن منده في الرد على الجهمية

ئەبو مالیکی ئەشعەری رضي الله عنه ئەفەرموویت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «الطُّهُورُ شَطرُ الإيمَانِ، وَالحَمدُ لِلَّهِ تَملأُ المِيزَانَ، وَسُبحَانَ اللَّهِ وَالْحَمدُ لِلَّهِ تَملَآنِ، أَو تَملأُ مَا بَينَ السَّمَاوَاتِ وَالأرضِ»[١].

واتا: دەستنوێژ نیوەی ئیمانە - مەبەست ئەوەیە نیوەی نوێژە - ، وە الحمد لله کردن تەرازووی چاکەکانت پڕ ئەکات لەڕۆژی دوایی دا، وە سبحان الله کردن و الحمد لله کردن نێوان زەوی و ئاسمانەکان پڕ ئەکەن.

أبو الدرداء رضي الله عنه ئەفەرموێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «أَثقَلُ شَيءٍ فِي المِيزَانِ يَومَ القِيَامَةِ خُلُقٌ حَسَنٌ»[٢].

واتا: قورسترین شت لەڕۆژی دوایی دا لەتەرازووی چاکەکانی ئیماندار دا ڕەوشتێکی جوانە.

وە أبو سلام ئەگێڕێتەوە لە مەولای پێغەمبەر ﷺ ابو سلمی کە شوانی پێغەمبەر ﷺ بووە کە ئەڵێت پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بَخٍ بَخٍ لِخَمْسٍ مَا أَثْقَلَهُنَّ فِي الْمِيزَانِ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَالْوَلَدُ الصَّالِحُ يُتَوَفَّى فَيَحْتَسِبُهُ وَالِدُهُ»[٣].

واتا: بَخٍ بَخٍ (ئەم وشەیە لای عەرەب بۆ ستایشکردن بەکارهاتووە)، پێنج شت هەن چەند قورسن لەتەرازووی کردەوە چاکەکاندا، لا إله إلا الله

---

(١) صحیح مسلم -کتاب الطهارة (٢) مسند الإمام أحمد (٣) مسند الإمام أحمد

کردن و الله أکبر کردن و سبحان الله کردن و الحمد لله کردن، وە منداڵێکی چاک ئەگەر بمرێت باوکی ئارامبگرێت و چاوەڕێی پاداشت بێت.

أبو هريرة رضي الله عنه ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ : سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ»[١].واتا: دوو وشە هەن سوک و ئاسانن لەسەر زمان،بەڵام قورس و گرانن لەتەرازوودا لای الله تعالی، دوو وشەی خۆشەویستن لای الله تعالی، ئەوانیش سبحان الله العظیم و سبحان الله وبحمده.

عبدالله ی کوڕی عمرو ی کوڕی عاص رضي الله عنهم ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی «خَصْلَتَانِ - أَوْ خَلَّتَانِ - لَا يُحَافِظُ عَلَيْهِمَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ، هُمَا يَسِيرٌ، وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ : يُسَبِّحُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ عَشْرًا، وَيَحْمَدُ عَشْرًا، وَيُكَبِّرُ عَشْرًا، فَذَلِكَ خَمْسُونَ وَمِائَةٌ بِاللِّسَانِ، وَأَلْفٌ وَخَمْسُمِائَةٍ فِي الْمِيزَانِ. وَيُكَبِّرُ أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ، وَيَحْمَدُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَيُسَبِّحُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، فَذَلِكَ مِائَةٌ بِاللِّسَانِ وَأَلْفٌ فِي الْمِيزَانِ»[٢]. واتا: دوو ئاكار و ڕەوشت هەیە هیچ بەندەیەكی ئیماندار و موسڵمان نییە پارێزگار بێت لەسەری و ئەنجامی بدات ئیللا ئەچێتە بەهەشتەوە، ئەو دوو شتە ئاسانن بەڵام ئەو کەسانەی

---

(١)صحيح البخاري (٢) سنن ابي داود

کە کار و کردوەی پێئەکەن کەمن، لەدوای هەر نوێژێک ١٠ جار سبحان الله بکات وە ١٠ جار الحمد لله بکات وە ١٠ جار الله أكبر بکات ئا ئەوە ١٥٠ یە بەزمان (واتا بەهەر پێنج نوێژەکە ١٥٠ جار ئەکات)، بەڵام ١,٥٠٠ لە تەرازووی کردەوە چاکەکانت لەڕۆژی دوای. وە ٣٤ جار الله أكبر بکات کاتێک چووە سەر جێگاکەی بخەوێت، وە ٣٣ جار الحمد لله بکات، وە ٣٣ جار سبحان الله بکات. ئائەمە سەت وێردە بەزمان، بەڵام لەتەرازووی کردەوە چاکەکانت لەڕۆژی دوایی بە هەزار هەژمێر دەکرێت.

«عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ، أَنَّهُ كَانَ يَجْتَنِي سِوَاكًا مِنَ الْأَرَاكِ، وَكَانَ دَقِيقَ السَّاقَيْنِ، فَجَعَلَتِ الرِّيحُ تَكْفَؤُهُ، فَضَحِكَ الْقَوْمُ مِنْهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : " مِمَّ تَضْحَكُونَ ؟ " قَالُوا : يَا نَبِيَّ اللَّهِ، مِنْ دِقَّةِ سَاقَيْهِ. فَقَالَ : " وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَهُمَا أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ مِنْ أُحُدٍ»[(١)].

واتا: زر ی کوڕی حوبەیش رضي الله عنه کە یەکێکە لەتابعین ئەڵێت کە هاوەڵی بەڕێز عبد الله ی کوڕی مەسعود رضي الله عنه سیواکی لێئەکردەوە .لەداری الأراك وە قاچەکانی باریک بوون،با هەڵی کرد و قاچەکانی دەرکەوتن و کەسانێک پێکەنین بە قاچەکانی. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەچی پێئەکەنن؟

وتیان ئەی پێغەمبەری خودا بە باریکی قاچەکانی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، قاچەکانی عبد الله ی کوڕی

(١) مسند الإمام أحمد

مەسعود لەڕۆژی دوایی دا لەتەرازوو لە ئوحود قورسترە.

**عەلی کوڕی أبي طالب** رضي الله عنه ئەڵێت: «أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ ابْنَ مَسْعُودٍ فَصَعِدَ عَلَى شَجَرَةٍ، أَمَرَهُ أَنْ يَأْتِيَهُ مِنْهَا بِشَيْءٍ، فَنَظَرَ أَصْحَابُهُ إِلَى سَاقِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ حِينَ صَعِدَ الشَّجَرَةَ فَضَحِكُوا مِنْ حُمُوشَةِ سَاقَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : مَا تَضْحَكُونَ ؟ لَرِجْلُ عَبْدِ اللَّهِ أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ أُحُدٍ[١]

واتا: پێغەمبەر ﷺ کە فەرمانی کرد بە عبد الله بن مسعود کە بچێتە سەر دارێک،ئەویش چوو ،فەرمانی کرد کە شتێکی بۆ بهێنێت(سیواکی بۆ لێبکاتەوە) ، هاوەڵەکان سەیری قاچی عبد الله ی کوڕی مەسعود یان کرد کاتێک بەسەر دارەکەدا سەرکەوت، پێکەنین بەهۆی باریکی قاچەکانیەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەچی پێئەکەنن؟، قاچەکانی عبد الله لەڕۆژی دوایی دا قورسترە لە ئوحود .

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو شتانەی کە لە ڕۆژی دوایی بەتەرازوو ئەکێشرێت، کەسەکە خۆی ئەکێشرێت وەک لەفەرموودەکەی أبو هريرة باسمان کرد. وە وتە و کردەوەی کەسەکە ئەکێشرێت(وەک الحمدلله کردن

(١) مسند الإمام أحمد.

و ڕەوشتی جوان کە پێشتر باسمان کرد)، وە نامەی کردەوەی کەسەکە ئەکێشرێت

صهیب ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

«إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ، وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، نُودُوا : يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ، إِنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ مَوْعِدًا. فَقَالُوا : أَلَمْ يُثَقِّلْ مَوَازِينَنَا، وَيُعْطِينَا كُتُبَنَا بِأَيْمَانِنَا، وَيُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ، وَيُنْجِينَا مِنَ النَّارِ؟»[١].

واتا: کاتێک کە ئەهلی بەهەشت چوونە بە هەشتەوە و ئەهلی ئاگر چوونە ئاگرەوە، بانگ ئەکرێن ئەی خەڵکی بەهەشت ئێوە لە لایەن اللہ تعالی وە بەڵێنێکتان پێدراوە

ئەوانیش ئەڵێت: ئایا تەرازووی چاکەکانی ئێمەی قورس نەکردوە اللہ تعالی؟

وە نامەی کردەوەکانی بەدەستی ڕاست نەداوە پێمان وە ئێمە بەدەستی ڕاست وەرمان نەگرتووە؟ وە ئێمەی نەکردۆتە بەهەشتەوە؟ وە ئێمەی لە ئاگر ڕزگار نەکردوە.

لێرەش هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە مەبەستمان ئەوەیە باسی تەرازوو کراوە

(١)مسند الإمام أحمد

أبي الأحوص ئەگێڕێتەوە لە **عبدالله بن مسعود** کە ئەفەرمووێت : «يُجَاءُ بِالنَّاسِ إِلَى الْمِيزَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، فَيَتَجَادَلُونَ عِنْدَهُ أَشَدَّ الْجِدَالِ»[١] .

واتا : خەڵکی لە ڕۆژی دوایی ئەهێنرێن بۆلای تەرازوو مشتوڕ ئەکەن لە لای تەرازوو توندترین مشتومڕ.

# جێگیرکردنی دوو ( تا ) بۆ تەرازوو

عبد الله بن عمرو بن العاص ئەگێڕێتە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

«إِنَّ اللَّهَ يَسْتَخْلِصُ رَجُلًا مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلًّا، كُلُّ سِجِلٍّ مَدَّ الْبَصَرِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا؟ أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ؟ فَيَقُولُ: لَا يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: أَفَلَكَ عُذْرٌ؟ فَيَقُولُ: لَا يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: بَلَى، إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً، وَإِنَّهُ لَا ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ، فَيُخْرِجُ بِطَاقَةً فِيهَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ، مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلَّاتِ؟ فَقَالَ: إِنَّكَ لَا تُظْلَمُ، قَالَ: فَتُوضَعُ السِّجِلَّاتُ فِي كِفَّةٍ، وَالْبِطَاقَةُ فِي كِفَّةٍ فَطَاشَتِ السِّجِلَّاتُ وَثَقُلَتِ الْبِطَاقَةُ، وَلَا يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللَّهِ شَيْءٌ»[٢].

واتا: الله ﷻ لێپرسینەوە ئەکات لەپیاوێک لەئوممەتەکەی من بەبەرچاوی خەڵکیەوە لەرۆژی دوایی دا،٩٩ تۆماری ئەم کەسە دەرئەکەن بۆ ئەم

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة . (٢)المستدرك للحاكم

کەسە، هەر تۆمارێک لەم تۆمارانە هێندە گەورەیە ئەوەندەی چاو بڕ بکات، پاشان الله تعالی بەم کەسە ئەفەرمووێت: ئایا نکۆڵیی هیچ شتێک لەمە ئەکەیت، ئایا فریشتەکان ئەوانەی نامەی بەندەکان ئەنوسن ستەمیان لێت کردووە، ئەڵێت: نەخێر ئەی پەروەردگار ستەمیان لێم نەکردووە، الله تعالی ئەفەرمووێت: ئایا بیانووێک یان چاکەیەکت هەیە نەمانهێنابێت؟، ئەو کەسە نازانێت چی بڵێت ، ئەڵێت: نەخێر ئەی پەروەردگار، الله تعالی پێی ئەفەرمووێت: نەخێر بەڵکو تۆ لای ئێمە کردەوەیەکی چاکت هەیە ئەمرۆ ستەمت لێ ناکرێت، پاشان بیتاقەیەکی بۆ دەرئەکرێ تێیدا نوسراوە "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ"، الله تعالی ئەفەرمووێت: بۆی بهێنن ، ئەڵێت: ئەی پەروەردگار ئەم بیتاقەیە چی پێ ئەکرێت لەگەڵ ئەم تۆمارانەدا؟ الله تعالی پێی ئەفەرمووێت: تۆ ستەمت لێ ناکرێت. ئەم تۆمارانە ئەکرێتە لایەکی تەرازووەکەوە وە بیتاقەکەش ئەکرێتە لایەکەی تری تەرازووەکەوە، بیتاقەکە تۆمارەکان ئەبات بە ئاسماندا، وە بیتاقەکە قورستر ئەبێت، هیچ شتێک قورستر نابێت لەبەرامبەر ناوی الله سبحانه وتعالى.

**سەلمانی فارسی** رضي الله عنه ئەفەرمووێت:

«يُوضعُ الميزانُ وله كِفَّتانِ، لو وُضِعَ في أحدهما السماوات والأرض ومَن فيهنَّ لوسِعَه، فتقولُ الملائكةُ: مَن يَزِنُ هذا؟ فيقولُ: مَن شِئتُ مِن خَلقِي، قال: فتقولُ الملائكةُ: ما عبدناك حقَّ عبادَتِك»[(١)].

---

(١)شرح أصول إعتقاد (٣/٤٤)

واتا: تەرازوو دائەنرێت لەڕۆژی دوایی دا، ئەم تەرازووە دوو تا ی هەیە، ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی کە تیایدایە بکرێتە تایەکی ئەم تارازووەوە ئەوا بەشی ئەکات و هێشتا کەمە بۆی، فریشتەکان ئەڵێن: کار و کردەوەی کێ بەو تەرازووە ئەکێشرێت وا هێندە گەورەیە؟، الله سبحانە وتعالی ئەفەرمووێت: بۆ

هەرکەسێک لەدروستکراوەکانم کە بمەوێت، فریشتەکان ئەڵێن: ئێمە تۆمان نەپەرستووە بەو شێوەی کە شایستەیت

**أبو أيوب** ئەڵێت:

«أَنَّ نَوْفًا وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو ابن العَاصِ اجْتَمَعَا، فَقَالَ نَوْفٌ : لَوْ أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا فِيهِمَا وُضِعَ فِي كِفَّةِ الْمِيزَانِ، وَوُضِعَتْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فِي

الْكِفَّةِ الْأُخْرَى لَرَجَحَتْ بِهِنَّ، وَلَوْ أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا فِيهِنَّ كُنَّ طَبَقًا مِنْ حَدِيدٍ، فَقَالَ رَجُلٌ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ لَخَرَقَتْهُنَّ، حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»[(١)].

واتا: نەوف - یەکێکە لە تابعینن- و عبد الله بن عمرو بن عاص - خۆی و باوکی کە سەحابەن رضي الله عنهم- پێکەوە کۆبوونەوە، نەوف وتی: ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی کە تیایدایە بکرێتە لایەکی تەرازووەوە وە

(١)مسند الإمام أحمد (٣٦٢/١١)

لا إله إلا الله بکرێتە لایەکەی تری تەرازووەوە، ئەوا لا إله إلا الله قورسترە، وە ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی تیایدایە پارچەیەک بن لەئاسن، کەسێک بڵێت لا إله إلا الله ئەم ئاسنە ئەبڕێت، هەتا ئەگاتەوە بە الله عز وجل.

**عبد الله ی کوڕی مسعود** رضي الله عنه ئەڵێت:

«أَنَّ رَاهِبًا عَبَدَ اللَّهَ فِي صَوْمَعَتِهِ سِتِّينَ سَنَةً، فَجَاءَتِ امْرَأَةٌ فَنَزَلَتْ إِلَى جَنْبِهِ، فَنَزَلَ إِلَيْهَا فَوَاقَعَهَا سِتَّ لَيَالٍ، ثُمَّ سُقِطَ فِي يَدِهِ، فَهَرَبَ، فَأَتَى مَسْجِدًا، فَأَوَى إِلَيْهِ، فَمَكَثَ ثَلَاثًا لَا يَطْعَمُ شَيْئًا، فَأُتِيَ بِرَغِيفٍ، فَكَسَرَ نِصْفَهُ ، فَأَعْطَى نِصْفَهُ رَجُلاً عَنْ يَمِينِهِ ، وَأَعْطَى آخَرَ عَنْ يَسَارِهِ، فَبَعَثَ اللَّهُ إِلَيْهِ مَلَكَ الْمَوْتِ فَقَبَضَ رُوحَهُ، فَوُضِعَ عَمَلُ السِّتِّينَ سَنَةً فِي كِفَّةٍ، وَوُضِعَتِ السَّيِّئَةُ فِي كِفَّةٍ، فَرَجَحَتِ السَّيِّئَةُ، ثُمَّ جِيءَ بِالرَّغِيفِ فَرَجَحَ بِالسَّيِّئَةِ»[١].

واتا: ڕاهیبێک الله تعالی ی ئەپەرست لەشوێنی پەرستشی خۆی ٦٠ ساڵ،

ئافرەتێک هات بۆلای، ئەم ڕاهیبە تووشی زینا بوو لەگەڵ ئەم ئافرەتە بۆ ماوەی شەش شەو، پاشان هەڵهات لەدەست ئەم ئافرەتە چووە مزگەوتێک و لەوێ مایەوە، سێ ڕۆژ مایەوە هیچی نەخوارد، پاشان کولێرەیەکیان بۆ هێنا، کولێرەکەی کرد بەدوو بەش، کەرتێکی دا بەپیاوێک لای ڕاستیەوە و کەرتەکەی تری دا بە پیاوێک لای چەپیەوە، پاشان الله

(١)مصنف ابن أبي شيبة (١٣/١٨٤)

تعالی فریشتەی ڕۆحکێشانی نارد و ڕۆحی ئەم ڕاهیبەی کێشا، کار و کردەوەی ٦٠ ساڵی خرایە تایەکی تەرازووەوە وە خراپەکانی خرایە تایەکەی تری تەرازووەوە، خراپەکانی قورستر بوون، پاشان ئەم کولێرەیە هێنرا، ئەم کولێرەیە خرایە تەزارووەوە و چاکەکانی زیاتر بوون.

**أبو بردة** رضي الله عنه ئەفەرموێت:

«لَمَّا حَضَرَ أَبَا مُوسَى الْوَفَاةُ ، قَالَ : يَا بَنِيَّ ، اذْكُرُوا صَاحِبَ الرَّغِيفِ ، قَالَ : كَانَ رَجُلٌ يَتَعَبَّدُ فِي صَوْمَعَةٍ أَرَاهُ ، قَالَ : سَبْعِينَ سَنَةً ، لاَ يَنْزِلُ إِلاَّ فِي يَوْمِ أَحَدٍ، قَالَ : فَنَزَلَ فِي يَوْمِ أَحَدٍ ، قَالَ : فَشُبِّهَ ، أَوْ شَبَّ الشَّيْطَانُ فِي عَيْنِهِ امْرَأَةً ، فَكَانَ مَعَهَا سَبْعَةَ أَيَّامٍ وَسَبْعَ لَيَالٍ ، قَالَ : ثُمَّ كُشِفَ عَنِ الرَّجُلِ غِطَاؤُهُ فَخَرَجَ تَائِبًا ، فَكَانَ كُلَّمَا خَطَا خُطْوَةً صَلَّى وَسَجَدَ ، قَالَ : فَآوَاهُ اللَّيْلُ إِلَى دُكَّانٍ عَلَيْهِ اثْنَا عَشَرَ مِسْكِينًا ، فَأَدْرَكَهُ الإِعْيَاءَ ، فَرَمَى بِنَفْسِهِ بَيْنَ رَجُلَيْنِ مِنْهُمْ. وَكَانَ ثَمَّ رَاهِبٌ يَبْعَثُ إِلَيْهِمْ كُلَّ لَيْلَةٍ بِأَرْغِفَةٍ، فَيُعْطِي كُلَّ إِنْسَانٍ رَغِيفًا، فَجَاءَ صَاحِبُ الرَّغِيفِ فَأَعْطَى كُلَّ إِنْسَانٍ رَغِيفًا ، وَمَرَّ عَلَى ذَلِكَ الَّذِي خَرَجَ تَائِبًا ، فَظَنَّ أَنَّهُ مِسْكِينٌ فَأَعْطَاهُ رَغِيفًا ، فَقَالَ الْمَتْرُوكُ لِصَاحِبِ الرَّغِيفِ : مَا لَكَ لَمْ تُعْطِنِي رَغِيفِي ؟ مَا كَانَ إِلَيَّ عَنْهُ غِنًى ، قَالَ : تُرَانِي أُمْسِكُهُ عَنْك ؟ سَلْ : هَلْ أَعْطَيْتُ أَحَدًا مِنْكُمْ رَغِيفَيْنِ ؟ قَالُوا : لاَ ، قَالَ : إِنِّي أَمْسِكُ عَنْك ، وَاللهِ لاَ أُعْطِيك شَيْئًا اللَّيْلَةَ ، قَالَ : فَعَمَدَ التَّائِبُ إِلَى الرَّغِيفِ الَّذِي دَفَعَهُ إِلَيْهِ ، فَدَفَعَهُ إِلَى الرَّجُلِ الَّذِي تُرِكَ ، فَأَصْبَحَ التَّائِبُ مَيِّتًا ، قَالَ : فَوُزِنَتِ السَّبْعُونَ سَنَةً بِالسَّبْعِ اللَّيَالِي فَلَمْ تَزِنْ ، قَالَ : فَوُزِنَ الرَّغِيفُ بِالسَّبْعِ اللَّيَالِي ، قَالَ : فَرَجَحَ الرَّغِيفُ ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى : يَا بَنِيَّ اذْكُرُوا

صَاحِبَ الرَّغِيفِ»[1].

واتا: کاتێک -أبو موسى الأشعري رضي الله عنه - لەسەرەمەرگدابوو فەرمووی ئەی کوڕەکانم یادی خاوەن کولێرەکە بکەنەوە، پیاوێک هەبوو لەشوێنێک پەرستشی خۆی ئەکرد نزیکەی حەفتا ساڵ ئەم کەسە دانەئەبەزی ئیلا ڕۆژێک نەبێت، شەیطان لەچاوی ئەم پیاوەدا خۆی کردە شێوەی ئافرەتێک، حەوت ڕۆژ یان حەوت شەو لەگەڵ ئەم پیاوەدا مایەوە و زینای لەگەڵ کرد، پاشان الله تعالى بەرچاوی ئەم پیاوەی ڕۆشن کردەوە و دەرچوو بەتۆبەکاری، ئەم پیاوە ڕاهیبە هەر هەنگاوێکی بنایە نوێژی ئەکرد و سوجدەی ئەبرد بۆ الله تعالى، بەشەو گەیشتە شوێنێک کە ئەم شوێنە دوانزە کەسی هەژاری لێبوو، ئەم پیاوە تۆبەکارە زۆر برسی بوو خۆی خستە نێوان دوو کەس لەو هەژارانە، وە کەسێکیش هەبوو ڕۆژی یەکی کولێرەیەکی ئەهێنا بۆ هەر یەکێک لەم کەسە هەژارانە، ئەم کەسە هات وە کولێرەی دا بەهەر بەیەکێک لەم هەژارانە، بەلای ئەم کەسە تۆبەکارەدا ڕۆیشت و وایزانی یەکێکە لەهەژارەکان و کولێرەیەکی داپێی(هەژارەکان دوانزە کەس بوون و ئەمیش دوانزە کولێرەی هێنابوو) وە لەکۆتایدا کەسێک لەهەژارەکان کە کولێرەی بەرنەکەوتبوو بەو کەسەی وت کە کولێرەکان ئەبەخشێت: بۆچی کولێرەکەت نەداپێم لەکاتێکدا تۆ بێ پێویستی لەو کولێرەیە، ئەویش پێی وت: وای ئەبینی من کولێرەکەم نەداوەپێت؟ بپرسە ئایا هیچ یەکێک لەوانە دوو کولێرەی پێدراوە؟ ئەوانیش وتیان:

---

(١)مصنف ابن أبي شيبة (١٣/١٨٥)

نەخێر، پاشان وتی: ئایا وا گومان ئەبەیت من کولێرەکەت نادەمێ؟، سوێند بە اللّٰه ئەمشەو هیچ کولێرەیەکت نادەمێ!، پاشان کەسە تۆبەکارەکە چوو کولێرەکەی خۆی بەخشی بەو کەسەی کە کولێرەکەی بەرنەکەوتبوو. بەیانی بووەوە ئەم کەسە تۆبەکارە وەفاتی کرد، کردەوەکانی حەفتا ساڵی پەرستشی بەو حەوت رۆژ یان حەوت شەوە کە زینای کردووە کێشرا لە تەرازوو، تاوانەکەی قورستر بوو لە حەفتا ساڵ پەرستشەکەی!، پاشان ئەم تاوانەی کێشرا بەو کولێرەیە کە بەخشی کولێرەکە قورستر بووا!. بۆیە أبو موسى رضي اللّٰه عنه ئەیفەرموو ئەی کوڕەکانم یادی خاوەن کولێرەکە بکەن!

## جێگیرکردنی زمان بۆ تەرازوو

**بەربەهاری** ئەڵێت:

«والإيمان بالميزان يوم القيامة، يوزن فيه الخير والشر، له كفتان ولسان»[1].

واتا: باوەڕهێنان بەتەرازوو لەرۆژی دوایی، کار و کردەوە باش و خراپەکانی پێ ئەکێشرێت، وە دوو تای هەیە و زمانی هەیە.

قال **عبد الملك بن أبي سليمان**:

«ذُكِرَ الميزان عند **الحسن**، فقال: له لِسان وكِفَّتانِ»[2].

---

(١)شرح السنة للبربهاري (٢)شرح أصول إعتقاد (٣/٤٥)

**عبد الملك بن أبي سليمان** ئەڵێت:

باسی تەرازوو کرا لای حەسەنی بەصری، فەرمووی: زمان و دوو تای هەیە

وە هاوشێوەیٚ ئەوە لە **الضحاك** هاتووە لەدواتر دا باسی ئەمەیان ئەکەین...

وە الكلبي لە **ابن عباس** ڕیوایەت ئەکات کە فەرموویەتی تەرازوو دووتای هەیە و وە زمانی هەیە، بەڵام الكلبي کەسێکی درۆزن و مەتروکە.

## حوکمی کەسێک کە نکۆڵیی تەرازوو بکات

باوەڕهێنان بە تەرازوو بنچینەیەکە لەبنچینەکانی ئەهلی سوننە وە جێگیرە لە قورئان و سوننەت وە ئاثاری هاوەڵاندا وە ئەهلی سوننەت و جەماعەت یەکدەنگن لەسەری، وە هەرکەسێک نکۆڵیی تەرازوو بکات یان بەوە لێکیبداتەوە تەرازوو لە دواڕۆژدا تەرازوویەکی حەقیقی و ڕاستی نییە بەڵکو مەبەست دادپەروەریە، ئەم کەسە کەسێکی دەرچووە لەسوننەت بەڵکو کەسێکی دەرچووە لەئیسلام .

**سفيان بن عيينة** رحمە الله ئەفەرمووێت:

«السُنّة عشرة ، فمن كن فيه فقد استكمل السُنّة ومن ترك منها شيئاً فقد ترك السُنّة : إثبات القدر،وتقديم أبي بكر وعمر، والحوض،

والشفاعة، **والميزان**، والصراط، والإيمان قول وعمل، والقرآن كلام الله، وعذاب القبر، والبعث يوم القيامة، ولا تقطعوا بالشهادة على مسلم»[١].

واتا: سوننەت ١٠ شتە، لەهەر کەسێکدا هەبێت ئەوە سوننەتی تەواو کردووە و ئەهلی سوننەیە، هەرکەسێک شتێک لەمانە وازلێبهێنێت ئەوا وازی لە سوننەت هێناوە و ئەهلی سوننە نییە،

وەیەکێک لەو ١٠ شتەی باسی کردووە بریتیە لە تەرازوو.

**ئیمام احمد رحمه الله** وە **علي کوڕی مەدینی** لە اصول السنة کانیان کە باسی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە ئەکەن ئەفەرموون:

«وَالْإِيمَانُ بِالْمِيزَانِ كَمَا جَاءَ: يُوزَنُ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ" فَلَا يُوزَنُ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ ، وَتُوزَنُ أَعْمَالُ الْعِبَادِ كَمَا جَاءَ فِي الْأَثَرِ. وَالْإِيمَانُ بِهِ وَالتَّصْدِيقُ بِهِ وَالْإِعْرَاضُ عَمَّنْ رَدَّ ذَلِكَ ، وَتَرْكُ مُجَادَلَتِهِ».

واتا: باوەڕهێنان بە تەرازوو وەک چۆن هاتووە، بەندە ئەکێشرێت لەڕۆژی دوایی دا سەنگ و قورسایی باڵەمێشولەیەکی نییە، وە کردەوەی بەندەکانیش ئەکێشرێت وەک چۆن لەفەرموودەکاندا هاتووە، باوەڕهێنان پێی و بەڕاست دانانی،وە پشتهەڵکرد لەوکەسەی کە نکۆڵی ئەکات و مشتومرنەکردن لەگەڵی.

**ابن أبي حاتم** ئەڵێت: «سَأَلْتُ أَبِي وَأَبَا زُرْعَةَ عَنْ مَذَاهِبِ أَهْلِ السُّنَّةِ فِي

---

(١)شرح أصول اعتقاد (١/٢٥٠)

أُصُولِ الدِّينِ ، وَمَا أَدْرَكَا عَلَيْهِ الْعُلَمَاءَ فِي جَمِيعِ الْأَمْصَارِ ، وَمَا يَعْتَقِدَانِ مِنْ ذَلِكَ ، فَقَالَا: أَدْرَكْنَا الْعُلَمَاءَ فِي جَمِيعِ الْأَمْصَارِ حِجَازًا وَعِرَاقًا وَشَامًا وَيَمَنًا فَكَانَ مِنْ مَذْهَبِهِمْ: "وَالْمِيزَانُ حَقٌّ ، لَهُ كِفَّتَانِ ، تُوزَنُ فِيهِ أَعْمَالُ الْعِبَادِ حَسَنُهَا وَسَيِّئُهَا حَقٌّ» [(١)].

واتا: پرسیارم کرد لەباوکم - **أبو حاتم** - و **أبو زرعة** دەربارەی بیرووباوەڕی ئەهلی سوننە لەبنچینەکانی دین وە لەوەی پێی گەیشتوونە لەزانایان لە

هەموو وڵاتەکان لەسەر ئەو بیرووباوەڕە بوونە، فەرموویان: گەیشتووینە بەزانایان لەهەموو وڵاتەکان لە حیجاز و عێراق و شام و یەمەن وە ڕێچکەی ئەم زانایانە ئەوەبووە کە:
تەرازوو حەق و ڕاستە، دوو تای هەیە کە کار و کردەوەی بەندەکانی تیا ئەکێشرێت کە چاکە و خراپەکانی تیا ئەکێشرێت حەق و ڕاستە.

**حنبل بن إسحاق** ئەڵێت:
«قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ اللَّهُ تَعَالَى ﴿وَنَضَعُ الْمَوَٰزِينَ الْقِسطَ لِيَومِ الْقِيَٰمَةِ﴾ (الانبياء : ٤٧)، وَقَالَ: ﴿وَمَن خَفَّت مَوَٰزِينُهُ﴾ (المُؤمنون : ١٠٣)، فَهُوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَمَنْ رَدَّ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَدَّ عَلَى اللَّهِ» [(٢)].

واتا: ئیمامی ئەحمەد رحمه الله فەرمووی، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَٰزِينَ الْقِسطَ لِيَومِ الْقِيَٰمَةِ﴾، وە فەرموویەتی: ﴿وَمَن خَفَّت مَوَٰزِينُهُ﴾،

---

(١)شرح أصول اعتقاد (٢)شرح أصول اعتقاد

ئەم لە کتێبی الله تعالی باسکراوە،جا هەرکەسێک نکۆڵیی لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بکات (واتە نکۆڵیی لە فەرموودەیەکی سەحیح بکات) ئەوا نکۆڵیی لە الله کردوە.

قال **عبد الرحمن بن أبي حاتم الرازي**: «سمعتُ أَبي، وسأَلتُه عن يوسف بن خالد السَّمتي، فقال: أَنكرتُ قول يحيى بن مَعين فيه أَنه زِنديقٌ، حتى حُمل إِليَّ كتابٌ قد وضَعَه في التجهم، بابًا بابًا، يُنكر الميزان في القيامة، فعلمتُ أَن يحيى بن مَعين كان لا يتكلم إِلا على بَصيرة وفَهم»[١].

**عبد الرحمن بن أبي حاتم الرازي** ئەڵێت :

گوێم لەباوکم بوو و پرسیارم لێکرد دەربارەی یوسف بن خالد السَّمتي ، وتی نکۆڵیی وتەکەی یحیی بن معین کرد کەدەربارەی ئەڵێت زندیق ە ، هەتا کتێبیکیان بۆ هێنام کەئەو نوسیبووی لەسەر جەهمییەت بەش بەش، نکۆڵیی تەرارزووی (المیزان) ئەکرد لەڕۆژی دواییدا ، ئەوکات زانیم کە یحیی بن معین قسە ناکات لەسەر خەڵکی ئیلا لەسەر بەرچاو ڕوونی و تێگەیشتن نەبێ.

بەسەنەدێکی زەعیف هاتووە **لەئیمام عومەر** رضي الله عنه کە فەرموویەتی:

«فإِنَّهُ سَيَأْتِي قَومٌ يُكذِّبون بالرَّجمِ وبالدَّجَّال، وبالميزان»[٢].

(١)الجرح والتعديل لابن أبي حاتم الرازي (٢)أصول السنة لابن ابي زمنين

واتا: لەکۆتای زەماندا کەسانێک دێن، ڕەجمکردن بەدرۆ ئەخەنەوە، وە هاتنی دەجال بەدرۆ ئەخەنەوە، وە تەرازوو لەڕۆژی دوایی بەدرۆ ئەخەنەوە

قال **عبد الملك**: «ومن كذب بعذاب القبر أو بشيء مما ذكر عمر في حديثه هذا: استتيب، فإن تاب وإلا قتل»[١].

**عبد الملك بن حبيب** دەربارەی ئەم وتەیەی ئیمام عومەر ئەڵێت:
هەرکەسێک نکۆڵیی سزای گۆڕ بکات یان بەیەکێک لەوانەی عومەر لە حەدیسەکەیا باسی کردووە، تەوبەی پێ ئەکرێ، تەوبە ئەکات ئەگەر نا ئەکوژرێت.

**ابن بطة** رحمه الله دەربارەی تەرازوو ئەفەرموویت:
«وَقَدِ اتَّفَقَ أَهْلُ اَلْعِلْمِ بِالْأَخْبَارِ وَالْعُلَمَاءُ وَالزُّهَّادُ وَالْعُبَّادُ فِي جَمِيعِ اَلْأَمْصَارِ أَنَّ اَلْإِيمَانَ بِذَلِكَ وَاجِبٌ لَازِمٌ»[٢].

واتا: ئەهلی زانست بەفەرموودەکان و زانایان وە خواپەرستان و ئەو کەسانەی دونیا بەکەمگرن، یەکدەنگن لەهەموو وڵاتەکان کە باوەڕهێنان بە تەرازوو واجبە و پێویستە.

---

(١)أصول السنة لابن ابي زمنين

(٢)الشرح والإبانة على أصول السنة والديانة

# ئەوانەی نكۆڵیی تەرازوویان كردووە لەڕۆژی دوایی

وە ئەوانەی نکۆڵیی تەرازوویان کردووە، جەهمییەکانن وە موعتەزیلەکانن، وتوویانە تەرازوو مەبەست تەرازوویێکی حەقیقی نییە کە هەستپێکراو بێت و دوو تای هەبێت و کردەوەی بەندەکانی پێ بکێشرێت وتوویانە تەرازوو مەبەست دادپەروەرییە.

- تەبعەن ئەمەش قسەیە پووچ و بەتاڵە، وە ئایەت و فەرموودەو ئەثەرەکان کە باسمان کردن بەسە بۆ هەڵوەشاندنەوە و ڕەددانەوەی ئەم قسەو بیرووبۆچونە

وە وتوویانە چ پێویست ئەکات کە الله تعالى کردەوەکان بکێشێک لەکاتێکدا الله تعالى زانایە بەکردەوەکان پێش هەبوونیان

- ئەمیش بیانوویێکی پووچە، چونکە بەم قسەیە بێت ئەبێت نکۆڵیی لوح المحفوظ بکەیت و وە نکۆڵیی نامەی کردەوەی بەندەکان بکەیت، الله سبحانه وتعالى لەڕۆژی دوایی دا بۆ بیانوو بڕکردنی بەندەکان تەرازووی داناوە بۆ بەرپاکردنی دادپەروەری، وەک چۆن الله تعالى لە لوح المحفوظ هەموو شتەکانی نووسیوەتەوە بەبێ ئەوەی الله تعالى پێویستی بەوەبێت ، الله تعالى زانایە بەهەموو شتێک پێش ئەوەی لوح المحفوظ بنوسێتەوە و وە دوای ئەوەی لوح المحفوظ بنوسێتەوە الله تعالى زانایە پێی و هیچ شتێک لێی شاراوە نەبووە، بەهەمان شێوە الله تعالى نامەی کردەوەی بەندەکان ئەنووسێت وە کرام الکاتبین ئەم دوو فریشتە بەڕێزەی داناوە کردەوەی

بەندەکان بنوسن الله تعالی خۆی زانایە پێی پێویستی پێی نییە بەڵام دایناوە بۆ بیانووبڕکردنی بەندەکان لەڕۆژی دوایی دا،

وەک چۆن الله تعالی نامەی کردەوەی بەندەکان دێنێتە قسەکردن وەک ئەفەرموێت:

﴿كُلُّ أُمَّة تُدعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا اليَومَ تُجزَونَ مَا كُنتُم تَعمَلُونَ | هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيكُم بِالحَقِّۚ﴾ (الجاثية : ٢٨-٢٩)

واتا: لەڕۆژی دوایی دا هەموو ئوممەتێک بانگ ئەکرێت بۆلای نامەی کار و کردەوەکانی، ئەمڕۆ پاداشتان ئەدرێنەوە بەو کار و کردەوانەی کە ئێوە ئەتانکرد وە ئەمە کتێب و نامەکەی ئێمەیە کە بەحەق قسەتان لەسەر ئەکات وە شایەدیتان لەسەر ئەدات.

الله سبحانە و تعالی لە ڕۆژی دواییدا ئەندامەکانی لاشەی بەندەکان دێنێتە قسەکردن و ئەیان کاتە شایەد بەسەر کردەوەی بەندەکانەوە.

وەک الله سبحانە و تعالی ئەفەرموێت :

﴿وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَاۖقَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (فصلت : ٢١)

واتا : کافرەکان لە ڕۆژی دواییدا بە پێستەیان ئەڵێن بۆچی شایەدیتان دا لەسەر ئێمە ئەوانیش ئەڵێن ئەو الله یەی هەموو شتێکی هێناوەتە قسەکردن ئێمەی هێنایە قسەکردن وە هەر ئەو سەرەتا ئێوەی دروست کردووە وە هەر بۆلای ئەویش ئەگەڕێنەوە.

وە الله سبحانە و تعالی ئەفەرمووێت :

﴿الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰ أَفْوَاهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (یس : ٦٥)

واتا : ئێمە لەڕۆژی دواییدا دەمی کافرەکان دائەخەین وە دەستەکانیان دێتە قسەکردن و شایەدیان لەسەر ئەدات وە پێیەکانی شایەدیان لەسەر ئەدات بەو کردەوانەی کردوویانە.

وە جەهمییەکان نکۆڵیی حەقیقەتی تەرازوو ئەکەن

**خشيش بن اصرم النسائي** ئەڵێت:

«وَأنكر جهم المِيزَان وَالله عز وَجل يَقُول: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَٰزِينَ القِسطَ لِيَومِ القِيَمَةِ﴾ (الانبياء : ٤٧)[١].

واتا: جەهم نکۆڵیی تەرازووی کرد، لەکاتێک الله تعالی ئەفەرمووێت:

تەرازووی دادپەروەرانە دائەنێین لەڕۆژی دوایی دا

# وەڵامی گومانەکان لەسەر مجاهد والضحاك والاعمش

وە لێرەدە گومانێک هەیە پێویستە جوابی بدەینەوە ئەویش ئەوەیە بەشێک لە ئەشعەریەکان وەک ابن الحجر و القرطبي و هاوشێوەی ئەوان کە

---

(١)التنبيه والرد على أهل الأهواء والبدع

هەندێک لە سەلەف تەفسیری ( المیزان ) تەرازوو یان کردوە بە العدل - دادپەروەری - ئەمان وا تێگەیشتونە کە زانایانی سەلەف هەر نکۆڵیی المیزان - تەرازوو - یان کردوە یانی باوەڕیان بەوە نەبووە کە هەبێت. جا ئەمەش قسەیەکی باتڵ و نادروستە.

بەڵکو تەفسیری ئەو زانایانە بۆ المیزان  بە دادپەروەری  مانای ئەوە نیە کە المیزان - تەرازوو - نیە ، وەک موعتەزیلە و جەهمییەکان ئەیڵێن، بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە کە المیزان یاخود تەرازووێکی دادپەروەرانە هەیە. وەک چۆن تابیعی گەورە پێشەوا مجاهد بن جبر رحمه الله لە تەفسیری فەرمایشتی الله تعالی :

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ | إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ (القيامة : ٢٢-٢٣)

فەرموویەتی : چاوەڕێی پاداشتی الله تعالی ئەکەن.

جا جەهمییەکان دەستیان گرتووە بەم وتەیەوە بۆئەوەی بڵێن مجاهد باوەڕی بە بینینی الله تعالی نەبووە لە ڕۆژی دواییدا.

بەڵام هەر لە پێشەوا مجاهد ووە هاتووە جێگیرکردنی بینینی الله تعالی لە ڕۆژی دواییدا. وە ئەم تەفسیرەش پێچەوانەی بینینی الله تعالی نیە چونکە بینینی الله تعالی لە ڕۆژی دواییدا پاداشتێکە لە پاداشتەکانی ئەو ڕۆژە.

بەهەمان شێوە تەفسیری هەندێک لە سەلەف  وەک مجاهد بۆ المیزان - تەرازوو - بە العدل - دادپەروەری -  پێچەوانەی ڕاستی و حەقیقەتی تەرازوو نیە. مەبەست پێی تەرازوویەکی دادپەروەرانەیە.

ابن حجر العسقلاني الأشعري لە شەرحی سەحیحی بوخاری ئەڵێت :

«قال **ابو اسحاق الزجاج** : "أَجْمَعَ أَهْلُ السُّنَّةِ عَلَى الْإِيمَانِ بِالْمِيزَانِ وَأَنَّ أَعْمَالَ الْعِبَادِ تُوزَنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَنَّ الْمِيزَانَ لَهُ لِسَانٌ وَكِفَّتَانِ وَيَمِيلُ بِالْأَعْمَالِ وَأَنْكَرَتِ الْمُعْتَزِلَةُ الْمِيزَانَ وَقَالُوا هُوَ عِبَارَةٌ عَنِ الْعَدْلِ فَخَالَفُوا الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ لِأَنَّ اللَّهَ أَخْبَرَ أَنَّهُ يَضَعُ الْمَوَازِينَ لِوَزْنِ الْأَعْمَالِ لِيَرَى الْعِبَادُ أَعْمَالَهُمْ مُمَثَّلَةً لِيَكُونُوا على أنفسهم شَاهِدِين»[(١)].

واتا : **ابو إسحاق الزجاج** وتوویەتی : ئەهلی سوونە یەکدەنگن لە باوەڕهێنان بە تەرازوو وە کاروو کردەوەی بەندەکان ئەکێشرێن لە ڕۆژی دواییدا وە تەرازو زمانێک و دوو تا ی هەیە وە بەکار و کردەوەکان بەرز و نزم ئەبێت، وە موعتەزیلە نکۆڵیی تەرازوویان کرد وە وتیان المیزان مەبەست ئەوە نیە تەرازوویەکی حەق و ڕاستی هەبێت بەڵکو مەبەست داددپەروەیە نەک تەرازوویەکی ڕاستی و حەقیقی بێت وە پێچەوانەی قورئان و سوننەتیان کرد لەبەر ئەوەی الله تعالى هەواڵی داوە کە لەڕۆژی دواییدا تەرازوو دائەنرێت بۆ کێشانی کاروو کردەوەکان بۆ ئەوەی بەندەکان کاروو کردەوەکانیان ببینن بە نمایشکراوی بۆ ئەوەی لەسەر خۆیان شایەد بن.

**تێبینی :** أبو إسحاق الزجاج ئەهلی سوننە نییە

جا بۆیە نکۆڵیی کردنی المیزان - تەرازوو - وە لێکدانەوەی بە دادپەروەری

(١)فتح الباري شرح صحيح البخاري ،

قسەی موعتەزیلەیە بەڵام کە مجاهد تەفسیری کردووە بە العدل - دادپەروەری - مەبەستی ئەوە نەبووە کە نکۆڵیی المیزان بکات وەک موعتەزیلە بەڵام هەرلێرەدا ابن الحجر ئەم وتەیە ئەداتە پاڵ پێشەوا مجاهد پاش هێنانەوەی قسەی ابن فورک الأشعري لە دواتردا ئەڵێت : «وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ السَّلَفِ إِلَى أَنَّ الْمِيزَانَ بِمَعْنَى الْعَدْلِ».

واتا : بەشێک لە سەلەف بۆ ئەوە ئەچوون کە المیزان- تەرازوو- واتای دادپەروەیە.

بێگومان ئەم وتەیەش وتەیەکی پوچ و باتڵە چونکە ئەو وا تێگەیشتوە لە تەفسیری مجاهد بۆ المیزان - تەرازوو - بەدادپەروەری کە پێشەوا مجاهد باوەڕی بە تەرازوویەکی ڕاستی و حەقیقی نەبێت هەر بۆیە لە دواتردا ئەڵێت ووتەی جمهور ڕاسترە واتا مەبەستی ئەوەیە کە المیزان تەرازوویەکی- ڕاستەقینەیە. وە ئەمەش وتەیەکی ناڕاست و نادروستە چونکە وەک باسمان کرد پێشەوا مجاهد کە فەرموویەتی المیزان - تەرازوو - مەبەستی پێی دادپەروەریە . مەبەستی ئەوە نەبووە کە نکۆڵیی هەبوونی تەرازوو بکات وەک موعتەزیلەکان و جەهمیەکان وائەڵێن

وە بۆیە **پێشەوا مجاهد** رحمه الله تعالى لە تەفسیری لە ئایەتی :﴿وَالْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ الْحَقُّ﴾ (الأعراف : ٨) ، واتا : تەرازوو لە ڕۆژی دواییدا حەق و ڕاستە. ئەفەرمووێت : قَالَ عُبَيْدُ بْنُ عُمَيْرٍ: «يُؤْتَى بِالرَّجُلِ الْعَظِيمِ الطَّوِيلِ الْأَكُولِ الشَّرُوبِ، فَلَا يَزِنُ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ» [١]

.

---

(١)تفسير الطبري

واتا : عبید بن عمیر فەرموویەتی  لەڕۆژی دواییدا کەسێکی باڵابەرز و گەورە و زۆر خۆر دێنن لای الله تعالی سەنگایی و قورسایی باڵە مێشولەیەکی نیە

پێشەوا مجاهد ئەم ئەثەرەی گێڕاوەتەوە لە عبید بن عمیر کە ئەم ئەثەرە بەڵگەیەکی زۆر ڕوونە لەسەر جێگیرکردنی  تەرازوو وە کێشانی کردەوەکان ، جا ئەم ڕیوایەتەی پێشەوا موجاهید ئەوە ڕوون ئەکاتەوە کە تەفسیری المیزان - تەرازوو - ی کردوە بە دادپەروەری مەبەستی ئینکاری کردنی ڕاستی و حەقیقەتی تەرازوو-نەبووە.

أبو الشيخ الأصبهاني ئەگێڕێتەوە کە **لوین** ئەڵێت:

«قَالُوا لِابْنِ عُيَيْنَةَ، وَأَنَا حَاضِرٌ: يَزْعُمُونَ أَنَّكَ تَقُولُ: الْقُرْآنُ مَخْلُوقٌ، قَالَ: مَا قُلْتُهُ، قَالُوا: يَزْعُمُونَ أَنَّكَ تَقُولُ: الْمِيزَانُ مَثَلٌ، قَالَ: مَا قُلْتُهُ، ثُمَّ قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ: ثنا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، عَنْ عُبَيْدٍ قَالَ: «يُجَاءُ بِالرَّجُلِ الْعَظِيمِ الطَّوِيلِ فَيُوضَعُ فِي الْمِيزَانِ، فَلَا يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ» [(١)]

واتا: وتیان بە ابن عیینة، کاتێک کە منیش ئامادە بووم، وتیان: پێیان وایە تۆ وتووتە قورئان مەخلوقە، ئەویش فەرمووی: وام نەوتووە، وە وتیان: پێیان وایە تۆ وتوتە تەرازوو نموونەیەکە(واتا ڕاستەقینە نییە و هەستپێکراو نییە)، ئەویش فەرمووی: وام نەوتووە ،

(١)طبقات المحدثين بأصبهان والواردين عليه

پاشان ابن عیینة فەرمووی: عمرو بن دینار بۆمانی گێڕایەوە، لە عبید کە فەرموویەتی: لەڕۆژی دوایی دا پیاوێکی گەورە و درێژ ئەهێنن ئەیکێشن لەتەرازوو کێش و سەنگایی باڵە مێشولەیەکی نییە.

هەر بۆیە پێشەوا سوفیانی کوڕی عویینە رحمە اللە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو گومانەی لەسەری بووە و بۆئەوەی بیسەلمێنێ کە وای نەووتوە وە باوەڕی بە تەرازوو هەیە ،ئەم ئەثەرەی عبید بن عمیر دێنێتەوە .

جا بەهەمان شێوە پێشەوا مجاهد رحمە اللە هەمان ئەثەری ڕیوایەت کردووە کە ئەمەش بەڵگەیەکی زۆر سەرێحە لەسەر جێگیرکردنی تەرازوو بەشێوەیەکی ڕاستەقینە. وە کە مجاهد تەفسیری المیزان ی کردوە بە دادپەروەری مەبەستی ڕەتکردنەوەی تەرازوو نیە وەک ئەوەی ابن الحجر الأشعري ئەیداتە پاڵی.

وە ئەم وتەیە القرطبي الأشعري لەتەفسیرەکەیدا داوەتیە پاڵ مجاهد و ضحاك و الأعمش کە گوایە وتویانە المیزان بەمانای دادپەروەیە نەک میزانی ڕاستەقینە و هەستپێکراو بێت،

بێگومان ئەم وتەیە باتڵ و نادروستە وە گەڕام نەم دۆزیەوەە لە ضحاك بەسەنەدەوە هاتبێت کە وای وتبێت وە الزجاج داوەتیە پاڵی لە معاني القران بەڵام الزجاج هەر خۆی بەو شێوە لێی تێنەگەیشتووە و لێکی نەداوەتەوە، هەربۆیە ئیجماع نەقڵ ئەکات دەربارەی ئەم بابەتە وەک باسمان کرد کە ابن الحجر نەقڵی کردووە.

وە خاوەني الدر المنثور ئەڵێت :

«وَأخرج ابْن الْمُنْذر عَن الضَّحَّاك فِي قَوْله ﴿فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ ﴾ قَالَ: إِلَى لِسَان الْمِيزَان ،﴿حَدِيد﴾، قَالَ: حَدِيد النّظر شَدِيد». (سورة ق : ٢٢)

واتا : ابن المنذر لە ضحاك ەوە گێڕاویەتیەوە کە دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى ﴿فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴿٢٢﴾

واتا : ئەمڕۆ بەچاوێکی تیژەوە سەیری ئەکەن و لێی دەڕوانن. کە فەرموویەتی : بەچاوێکی تیژەوە تەماشای زمانی تەرازوو ئەکات.

وە فەرموویەتی : حدید - مانای تەماشاکردنێکی تیژە.

جا ئیمامی الضحاك رحمه الله ئەگەر ئەوە جێگیر بکات کە تەرازوو زمانی هەیە، ئیتر چۆن باوەڕی بەبوونی تەرازوو نییە؟

وە القرطبي کە ئەو وتەیەی داوەتە پاڵ مجاهد و الضحاك، سبحان الله هەر خۆی لەتەفسیرەکەی، لەتەفسیری ئایەتی ﴿فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴿٢٢﴾

ئەڵێت:

«قَالَ مُجَاهِدٌ: ﴿فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴿٢٢﴾

يَعْنِي نَظَرَكَ إِلَى لِسَانِ مِيزَانِكَ حِينَ تُوزَنُ سَيِّئَاتُكَ وَحَسَنَاتُكَ. وَقَالَهُ الضَّحَّاكُ».

واتا: موجاهید لەتەفسیری ئەم ئایەتە فەرموویەتی: تەماشای زمانی تەرازوو ئەکەیت، کاتێک چاکەکان و خراپەکانت ئەکێشرێن. وە الضحاك یش بەهان شێوەی فەرمووە.

والله المستعان.

**وصلى الله على نبينا وعلى اله وصحبه وسلم**